ژوری ڕاپۆرتەکانی
ناوەندی کوردزاگ

---

ڕامیاری مێژوویی



دەستەی کوردزاگ بۆ
هۆشیار کردنەوەی
نەتەوەیی کورد

# (ئاڵای کوردستان و مێژووەکەی)

ئامادەکردن: شاهۆ جەلال خدر

بڵاوکراوە: ناوەندی کوردزاگ

2023-2024



# ئاڵای کوردستان و مێژووەکەی

نوسین و ئامادەکردنی: **شاهۆ جەلال خدر**

ژوری ڕاپۆرتەکانی ناوەندی کوردزاگ-گۆشەی

**ڕامیاری و مێژووی**

www.kurdzag.com

2023

# پێڕست

| ژمارەی لاپەڕەکان | بابەت |
|---|---|



# پێشەکی

سڵاوی خودای گەورە و تاك و تەنها و درووستکەری جیهانتان لێ بێ، لەم ڕاپۆرتەدا باسمان لە گرنگی ئاڵا و مێژووی درووست بوونی ئاڵای کوردستان کردووە لەگەڵ شیکردنەوەی ڕێزمانی ناوی ئاڵا بەکوردی.

خۆم بەخۆشحاڵ دەزانم کە توانیم ئەم ڕاپۆرتە بنوسم و لەناوەندی کوردزاگ بڵاوی بکەمەوە سووپاسی هەموو ئەندامانی کوردزاگ دەکەم بۆ یارمەتیدان.

ئەم ڕاپۆرتە پێشکەشە بە ئەندامانی کوردزاگ و نەتەوەییەکان و سەرجەم کورد و کوردستانیان و شەهیدان و هێزی قارەمانی پێشمەرگە، درود و سڵاو لە گیانی پاکی پاشا کەیخەسرە و پاشای گەورەی میرنشینی سۆران و شێخ سەعیدی پیران و سەید ڕەزای دێرسیم و شێخ عوبەیدوڵای نەهری و شێخ مەحمود و جەنەڕاڵ ئیحسان نوری پاشاو قازی محمدی نەمر.



# دەستپێك

٧٧ ساڵ لەمەوپێش لە ١٧-١٢-١٩٤٦دا ئاڵای کوردستان لەدوای کۆتایهاتنی کۆماری کوردستان لەمەهاباد داگیرا. (١)

بەم هۆکارە ڕۆژی ١٧-١٢ وەك ڕۆژی ئاڵای کوردستان دەستنیشانکراوە لە هەرێمی کوردستان و لەدامودەزگا فەرمییەکان ساڵانە هاوشێوەی ساڵانی ڕابردوو، یادی دەکرێتەوە و بۆنە و ڕێوڕەسمی تایبەت بەو بۆنەیەوە بەڕێوەدەچێت و ئاڵای کوردستان هەڵدەکرێت.(٢)
ساڵی ١٩٩٩ یاسای ژمارە ٤ بۆ ئاڵای کوردستان پەسەندکراوە و پێکهاتەی ئاڵای کوردستان رونکراوەتەوە. پەرلەمانی کوردستان بە بڕیاری ژمارە ٤٨ ی ڕۆژی ١٩-٦-٢٠٠٤ ئەو ڕۆژەی دیاریکردووە.



# ئاڵا چییە؟

ئاڵا بریتییە لە پارچە قوماشێک کە نوێنەرایەتی وڵاتێك یان ڕێکخراوێك یان گروپێك یان کۆمەڵەییێك و دەستەییێك و هۆزێك دەکات.(٣) بەزۆری شێوەی چوارگۆشەیە و هێما و ڕەنگ یان نەخشی جۆراوجۆری تێدایە کە گرنگی بۆ گروپی نوێنەرایەتیکراو هەیە. ئاڵا نیشانە وناسنامەی نەتەوە و هەبوونی گەلانە، ئەمڕۆ هەموو گەل نەتەوەیەکی خاوەن وڵاتی سەربەخۆ و بێ وڵات خاوەن ئاڵای تایبەت بەخۆیانن.(٤)

دەتوانرێت ئاڵا لەسەر دارەکانی ئاڵا هەڵبکرێت، لەسەر بیناکان نمایش بکرێت، لە کاتی نمایش یان نارەزایەتیدا هەڵبگیرێت، یان لە چوارچێوەی جۆراوجۆری ڕێوڕەسمی یان ڕەمزیدا بەکاربهێنرێت. وەك نوێنەرایەتییەکی بینراوی ناسنامە و شانازی نەتەوەیی. ئاڵاکان گرنگییەکی گەورەی کولتووری و مێژوویی و سیاسییان هەیە.(٥)



# مانای ناوی ئاڵا بەکوردی

ئاڵا وشەییێکی کوردییەو لە دوو بڕگەی "ئا+لا " پێك دێت، لە مێژووی کوردا چەندین زاراوەی تر بەکارهێنراون وەکو "بەیرەق، ئالە، بەندێر، بەیداخ، ئالایی و پەرچەم.(٦)

وشەی ئاڵا لەڕووی درووست بونیەوە چەند سەرنجێکی جیاوازی لەسەرە هەژار موکریانی لە هەنبانە بۆرینەدا دەڵێ وشە ئاڵا لە هە ئاڵاندن ەوە هاتووە، ئاڵاندن لە زمانی کوردیدا بۆ شتێك بەکاردێ کە بپێچرێتەوە بە شتێك بۆ نموونە ئاڵاندنی بەنێك لەدەزوێك، هەروەها دەڵێ ئاڵا بەرگی بوکی منداڵە، لەم وشەیەدا مانای پێچاندن خۆی حەشارداوە چونکو ئاڵا ئەو کوتەپەڕۆیەیە کە لە دەوری بوکەڵە دەپێچرێ.(٧)

سەرنجێکی تر دەڵێ وشەکە لەزمانی کوردیدا شێوەی "ئاڵ" و "ئالا" هەیە وا دیارە بە هۆی ڕەنگی سووری ئاڵاوە، بەتایبەتی لە دەوڵەتی عوسمانی (و پێشتریش سەلجووقی)دا، ئەم وشەیە واتای 'ئاڵا'ی وەرگرتووە.



له توركییشدا، له توركیی كۆنەوە، وشەی "ئال" (یان "ئەل") واتای 'ڕەنگ' و بەتایبەتی 'ڕەنگی سوور'ی گەیاندووە، و "ئالا" (یان "ئەلە")یش بە واتای 'ڕەنگین'ـە (کە ئەمەیان ڕەنگە بنچینەی "ئاڵا"ی کوردی بێت بە واتای 'ڕەنگاوڕەنگ'، و ئەگەریشی هەیە "ئاڵا"ی کوردی لە بنەڕەتدا وەکوو "ئاڵ" بە واتای 'سووری کاڵ' بێت و ڕەسەن بێت، وەکوو چۆن لە فارسییشدا "آلا" هەمان واتای "آل" دەدات).

وشەی "ئال" توركیی ڕەسەنە و ڕیشەی ئەڵتاییشی هەیە، ئەگەرچی لە بەرامبەریشدا "ئاڵ"ی کوردی و فارسی (بە واتای 'سووری گەش' یان 'سووری کاڵ') ڕەسەنە، و پێشتریش لە پەهلەویدا هەر "ئال" بووە، و لە ڕیشەی زاگرۆسیە.
هەرچەند ئەو بیروڕایەش هەیە کە وشە ئێرانیەکە لە بنچینە توركیەکەوە هاتبێت.



# مێژووی درووست بوونی ئاڵای کورد و کوردستان

مێژووی دروستبوون و هاتنە کایەی ئاڵا لەکوردستان دەگەڕێتەوە بۆ ٤٠٠٠ (چوار هەزار) ساڵ لە مەوبەر، بۆ یەکەمجار ئاڵا لەلایەن ئیمپراتۆریەتەکانی سەر خاکی کوردان و میزۆپۆتامیا (کوردستانی ئەمڕۆ) هەڵدراوە، سەرەتا گۆتیەکان و سۆمەرییەکان و ئاشورییەکان و میدیاکان و ئیلامیەکان(٨)، دواتر هاخەمەنیشیەکان و ساسانییەکان و ئەیوبیەکان و میرنشینە کوردیەکان و هێزە شۆڕشگێڕە کوردیەکان و حکومەتەکان ئاڵای کوردستان هەڵکراوە.



گۆتیەکان



سۆمەریەکان



ئاشوریەکان



میدیەکان(ماد)



ئیلامیەکان



ئەخمینیەکان



ساسانیەکان



ئەیوبیەکان



میرنشینی سۆران



شانشینی کوردستان



کۆماری ئارارات

ئاڵای فەرمی



هەرێمی کوردستان(کورد و کوردستان)

نەتەوەی کورد



کۆماری کوردستان



# ئالای میرنشینی سۆران

میرنشینی سۆران یەکێك بوو لە میرنشینە کۆنە کوردییەکان و بەپێی وتەی مێژوونووسان لە ساڵی ١٣٩٩ دا لەسەر دەستی میر کەڵۆس بەگ دامەزراوە لە گوندی هاودیان لە ناوچەی ڕەواندز دامەزراوە.
درەوشانەوەی میرنشینی سۆران لە سەردەمی دەسەڵات گرتنە دەستی (میر محەمەد(پاشای گەورە)دا بووە.(٩)
لەم سەردەمەدا میرنشینەکە سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاندووە بووەتە خاوەن هێز و دراو چەك و جبەخانەی خۆی ناوی کوردستانیان بەکار هێناوە بۆ سەر درا و چەك و نامەکانیان. (١٠)
ئاماژە بە هەبوونی ئالای پاشای گەورە کراوە و دەڵێن: میرنشینی بۆتان و میرنشینی سۆران، دووان لە میرنشینە بەهێز و ناسراوەکانی مێژووی کوردستانن کە شوێنگەی دیرۆکی و جوگرافیان کەوتۆتە ناو ئینساکلۆپیدیا و ئەتڵەسە کۆنەکانی جیهانەوە، میرنشینی سۆران لە سەردەمی پاشای گەورە خاوەن ئالایەکی تایبەت بە خۆی بوو



که له دوو ڕەنگی ڕەش و سپی پێکهاتبوو، ڕەنگی ڕەش له بەشی سەرەوەی و ڕەنگی سپی له خوارەوەی ئاڵاکەیدا بوو، ئەم ئاڵا هەڵکردنه بۆ سەردەمی پاشای گەوره دەگەڕێتەوە، پێشتر دیار نەبووه یان زانیاری له بەردەستدا نییه که ئاڵای کورد هەڵکرابێ، واته هەڵکردن و پەیداکردنەکه بۆ سەردەمی زێڕینی ئەو میره دەگەرێتەوە، له سەرچاوەیەکی عەرەبیدا که تایبەته به گرنگی به ئاڵا و مێژووی کۆن و بەتایبەتی هۆز و نەتەوه و وڵاته عەرەبییەکان، تیشك دەخاته سەر ئاڵای پاشای گەوره، بەم شێوەیه باسی ئاڵاکه هاتووه "ئەو کاتەی که هۆزی سۆران که هۆزێکی کوردییه و گەشەی کردووه له سەدەی شازدەهەمدا له باشوور که ڕەواندز پایتەختەکەی بووه له هەرێمی کوردستان به بەردەوامی تا ساڵی ١٨٣٧ شکستی هێنا له سەر دەستی عوسمانییەکان، یەکەم ئاڵای کوردی بووه که به شێوەیەکی فەرمی بەرزکرابێتەوە له نێوان ساڵانی (١٨١٦ بۆ ١٨٣٦) ڕەنگەکەی ڕەش و سپی بووه، ڕەنگی ڕەش نیشانەی دەسەڵاته واته دەسەڵاتداری و ڕەنگی سپیش نیشانەی پاکی و ئاشتییه".(١١)



# ئاڵای شانشینی کوردستان

شانشینی کوردستان وڵاتێکی تەمەن کورتی کوردی بوو لە باشووری کوردستان کە لەلایەن شێخ مەحموودی حەفید لە ٢٢ی ئەیلوولی ١٩٢١ دامەزرا و دوایی لە تەمووزی ساڵی ١٩٢٥ هەڵوەشێنرایەوە، هاوکاتیش هیچ لایەنێك بە فەرمی پاڵپشتی ئەو وڵاتەی نەکردبوو، پایتەختەکەی شاری سلێمانی بوو.(١٢)

ئاڵای شانشینی کوردستان لەلایەن ڕەفیق حیلمیەوە پێشنیاز کراوە لەسەر هەمان ئاڵای گۆتیەکان درووستکراوە بەچوارچێوەییێکی ئیسلامی.



کۆمەڵێك خوێندکاری کوردی سڵاو لە ئاڵای شانشینی کوردستان دەکەن



# ئالای خۆیبوون و ئارارات

لەسەردەستی کەسێك بەناوی (خەلیل بەگ) کە سەرۆکی رێکخستنی ئازاد بووە دروستکراوە(نازانرێت خۆی دروستی کردووە یان هونەرمەندێکی راسپاردبێت) و بە دیاری داویەتی بە (ئیحسان نوری پاشا) ی دەسەڵاتداری میرەکانی ئارارات، هەر لەو کاتەدا (حیزبی خۆیبوون) لەباکوری کوردستان، هەر لەوکاتەوە لە زۆرینەی ئەو شوێنانەی دەسەڵاتیانی تێدابووە ئەو ئالایەیان وەك ئالای کوردستان بەکار هێناوە، خۆیبوون ئالایان خستۆتە نێو میدیای سەردەمی خۆیان وێنەی ئەم ئالایەیان خستۆتە سەر بەرگی گۆڤاری (هاوار) کە لەلەندەنی پایتەختی بەریتانیا دەردەچوو.(١٣)





# ئالای خۆیبوون و ئارارات

لە دوای کۆتایهاتنی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران، کۆمەڵێك ئەفسەر و کەسایەتی گرنگی کورد کەوتنە خۆ و لەساڵی ١٩٢٧کۆماری ئاراراتیان ڕاگەیاند لەچیای ئاگریداغ، جەنەڕاڵی سووپاس ئیحسان نوری پاشا بوو سێ ساڵ بەردەوام بوون لەشەڕکردن لەگەڵ تورکان.(١٤)
ئاڵای کۆماری ئارارات و شۆڕشی ئاگریداغ بەم شێوەیە بوو (ڕەنگی سەوز لەسەرەوە و ڕەنگی سوور لە خوارەوەو ڕەنگی سپی لە ناوەراستدا و هەبوونی خۆرێکی زەردی بازنەیی کە هەر دوو ڕەنگی سەوزو سوورەکەی بەیەك گەیاندووە بە شێوەی بازنەیی و لەناویدا وێنەی چیای (ئاگری) لەسەر دروست کراوە کە بەفر ترۆپکەکانی داپۆشیووە.(١٥)





# ئاڵای کۆماری کوردستان (مەهاباد)

لە ڕۆژی ٢ ڕێبەندانی ٢٧٤٥ کوردی ٢٢-١-١٩٤٦ دوای کۆبونەوەی سەرجەم گەورە پیاوانی هەر چوار پارچەی کوردستان لەگۆڕەپانی چوارچرای شاری مەهاباد قازی محمدی کۆماری کوردستانی ڕاگەیاندو (١٦) سوێندی بەقورئان و ئاڵای کوردستان خواردووە.(١٧)

ئاڵای کۆماری کوردستان ڕەنگی سوور لەسەرەوەیە ڕەنگی سپیش لەناوەند و ڕەنگی سەوزیش لەخوارەوە لەناوەندی کورە خۆرێك هەیە و قەڵەمێکی بەسەرەوەیە لەملاو لەولاش دوو گوڵە گەنم هەن(١٨)





# ئاڵای کۆماری کوردستان (مەهاباد)

سوێندەکەی قازی محمد

ئەمن بە خودا بە کەلامی عەزیمی خودا، بە نیشتمان، بە شەرافەتی میلەتی کورد.
بە ئاڵای موقەدەسی کوردستان سوێند دەخۆم کە تا ئاخرین هەناسەی ژیانم و
ڕژانی دوایین تنۆکی خوێنم بە گیان و ماڵ لە ڕێی ڕاگرتنی سەربەخۆیی و
بەرز کردنەوەی ئاڵای کوردستان دا تێ دەکۆشم.(١٩)

سەیدزادە فاتیمە ناوی تەواوی (سەیدزادە فاتیمە سەید مەناف سەید حسێنی)یە و خەڵکی شاری مەهابادە، ئاڵای کۆماری کوردستانی بە دەستی خۆی دووریویە و نەخشاندوویە.

ناوبراو هاوژینی کەریم ئەحمەدین، وەزیری پۆست و تەلەگراف و تەلەفۆنی کۆماری مەهاباد بووە.(٢٠)





# ئاڵای کۆماری کوردستان (مەهاباد)

هەژاری موکریانی لە شیعری ئاڵای کوردستاندا کە لە ژمارەی یەکی رۆژنامەی کوردستاندا لە ١١-١-١٩٤٦ بڵاوکراوەتەوە لە وەسفی ئاڵای کوردستاندا دەڵێت:

بێ ببینێ ئەو کەسەی پێی وایە کورد سەرناکەوێ
کێ بوو پێی وابوو تەمی نەگبەتی لەسەرمان نارِەوێ
داری ئاڵاکەم وەکو چقڵێکە بۆ چاوی عەدوو
هەر دڵێ خۆشی نەوێ رەبی وەبەر خەنجەر کەوێ
پارچەکەی سێ رەنگی خۆی دەنوێنێ رەنگی سور دەڵێ
تا تنۆکێ خوێنی کورد مابێ قەدی من نانەوێ
سپییەکەی مژدەی بەیانی بەختی کورد کرد بەیان
رۆژی بەختی کوردی پەیدا بوو نەما پەردەی شەوێ
دوو گوڵی گەنمی دەڵێ ئاگات لە رزقی خۆت بێ
خۆت کە برسی بوو چی دوژمن پێی بژین لێرەو لەوێ
پێو دەڵێ نوکی قەڵەم گەر ژینی خۆش و پێی دەوێ
غەیری من دەست ناکەوێ بورجی تەرەقی پێش رەوێ
رەنگی سەوزی یانی دایکی ( نیشتمان) لەو رۆکەوە
جوان و سەرسەوزە وەرگیری کەوتەوە عومری نوێ
لاوەکان ناموسی نۆ ملیۆنە ئەو ئاڵایەمان
گیان بدەن بۆ حیفزی ئەو ناموسەتان لەمنوکەوێ

کوردستان

هەلکردنی آلای مقدسی کوردستان

ئــــالا          هەژار موکریانی
بێ ببینێ ئەو کەسەی پێی وایە کورد سەرناکەوێت
کێ بوو پێی وابوو تەمی نەگبەت لەسەرمان نارِەوێ
داری ئاڵاکەم وەکو چقلێکە بۆ چاوی عەدوو
هەردڵێ خۆشی نەوێ رەبی وەبەر خەنجەر کەوێ
پارچەکەی سێ رەنگی خۆی دەنوێنێ رەنگی سور دەڵێ
تا تنۆکێ خوێنی کورد مابێ قەدی من نانەوێ
سپیەکەی مژدەی بەیانی بەختی کوردی کرد بەیان
رۆژی بەختی کوردی پەیدا بوو نەما پەردەی شەوێ
دوو گوڵی گەنمی دەڵێ ئاگات لە رزقی خۆت بێت
خۆت کە برسی بو چی دوژمن پێی بژین لێرەو لەوێ
پێو دەڵێ نوکی قەڵەم گەر ژینی خۆش و پێ دەوێ
غەیری من دەست ناکەوێ بورجی تەرەقی پێش رەوی
رەنگی سەوزی یانی دایکی : نیشتیمان : لەو رۆکەوە
جوان و سەرسەوزە وەگیری کەوتەوە عومری نوێ
لاوەکان ناموسی نۆ ملیۆنە ئەو ئاڵایەمان
گیان بدەن بۆ حیفزی ئەو ناموسەتان لە منو کەوێ

ئاڵای کۆماری کوردستان ـ مەهاباد



## ئاڵای هەرێمی کوردستان(ئاڵای نەتەوەیی کورد)

لە ١١-١١-١٩٩٩ لەپەرلەمانی کوردستان بڕیاردرا هەرێمی کوردستان ببێتە خاوەن ئاڵای فەرمی خۆی بەم مەبەستە، بۆیە یاسایێك دەرچوو تایبەت بە ئاڵای کوردستان و ١٠ مادە لەخۆدەگرێت بەم شێوەیە:

ماددەی یەکەم:

هەرێمی کوردستان ئاڵایەکی دەبێت بە شێوەیەکی لاکێشەیی، کە پانییەکەی دوو لەسەر سێی درێژیەکەی دەبێت و دابەش کراوە لەسەر سێ لاکێشەی ئاسۆیی یەکسان لە درێژی و پانی داو، پێکهاتەکەی بەم شێوەیەیە:

١- لاکێشەی سەرەوە ڕەنگی سورە هێمای شەهیدانی ڕزگاری بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردە.

٢- لاکێشەی ناوەڕاست ڕەنگی سپی دەبێت، هێمای ئاشتی و ئازادی و دیموکراسی و لێبوردنە، کە خەڵکی کوردستان ئاواتەخوازیەتی.



## ئاڵای هەرێمی کوردستان(ئاڵای نەتەوەیی کورد)

٣- خۆرێکی زەرد دەکەوێتە ناوەڕاستی لاکێشە سپیەکەوە، چەقەکەی خاڵی یەکتربڕینی تیرەی لاکێشە سپیەکە دەبێت و ٢١ تیشکی لێوە دەردەچێت بە شێوەی سێ گۆشەی دوولا یەکسان و بنکەکانی یەک لەسەر بیست و یەك لە چێوەی گۆی خۆرەکە دەبێت و درێژیشیان بکاتە نیوەی هەردوو

لاکێشە سوور و سەوزەکە. خۆرە زەردەکە هێمای بەردەوام بوونی ژیان و زانست و هیوا و ئومێدەو ٢١ بیست و یەك تێشکەکەش هێمای جەژنی نەورۆزی نەتەوەییە، ڕۆژی بەرخۆدان و ڕاپەڕین و شۆڕشی ڕزگاری دژ بە زوڵم و چەوساندنەوە.

٤- لاکێشەی خوارەوە ڕەنگی سەوز دەبێتو هێمای کشتوکاڵ و سروشت و ژینگەی کوردستانە.

**ماددەی دووەم:**

ئەو جێگایانەی کە ئاڵاکەی لەسەر هەڵدەدرێت لەسەر پەیڕەو دیاری دەکرێت.



# ئاڵای هەرێمی کوردستان(ئاڵای نەتەوەیی کورد)

ماددەی سێیەم:
هەڵکردنی ئاڵا لە کاتی خۆرهەڵاتندا دەبێت و هاتنە خوارەوەشی لەکاتی خۆرئاوابووندا.

ماددەی چوارەم:
دروست و چاپ و دابەشکردنی ئاڵا بە ڕەزامەندی وەزارەتی ڕۆشنبیری دەبێت.

ماددەی پێنجەم:
نابێت ئاڵا لە بۆنە نیشتیمانی و نەتەوەیی و ئاهەنگەکاندا بەرزبکرێتەوە یان بەکار بێت، ئەگەر هات و کەم و کوڕی هەبوو لەمەڕ گۆڕانی ڕەنگەکانی و پاك و پوختی و دڕانی.

ماددەی شەشەم:
هەڵدانی ئاڵا شان بە شانی ئاڵای عێراق دەبێت و لەو بۆنانەی کە ئاڵای عێراقی تێیدا هەڵدەدرێت و تا قەوارەی دەستوری فیدڕاڵیەت دەچەسپێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە عێراقدا.



## ئاڵای هەرێمی کوردستان(ئاڵای نەتەوەیی کورد)

ماددەی حەوتەم:

ئەنجوومەنی وەزیران بۆی هەیە پەیڕەوێکی تایبەتی دەربکات بۆ ئاسان کردنی جێبەجێکردنی بەندەکانی ئەم یاسایە.

ماددەی هەشتەم:

کار بە هیچ دەقێك ناکرێت لەگەڵ حوکمەکانی ئەم یاسایەدا ئەگەر هاودژبێت.

ماددەی نۆیەم:

دەبێ ئەنجوومەنی وەزیران ئەم یاسایە جێبەجێ بکات.

ماددەی دەیەم:

ئەم یاسایە لە مێژووی دەرهێنانیەوە جێبەجێ دەکرێت و لە ڕۆژنامەی فەرمیدا بڵاودەکرێتەوە.(21)



# ئاڵای هەرێمی کوردستان(ئاڵای نەتەوەیی کورد)

هەر کەیانێکی سیاسی بە جیاوازی پلە و شێوازە دەستوریەکەیەوە، ئاڵایەکی هەیە کە گوزارشت لە جوامێری و کەرامەتی گەلەکەی دەکات و سومبولیەتی، لە شێوە و ڕەنگ و پێکهاتەکەیدا، پاڵوانێتی ئەو گەل و نیشتیمانە و سەربەرزیەکانی ڕەنگ دەدەنەوە.
دەوڵەت تاکە کەیانێکی سیاسی نیە کە ئاڵایەکی جیاواز بۆ خۆی دەستنیشان بکات، بەڵکو ئەو هەرێمانەی کە لەژێر چاودێریدا بوون و ئەو کەیانانەی کە لە ژێر ئینتیداب و پارێزگاری دەوڵەتاندا بوون. هەروەها ئەو هەرێم و ویلایەت و میرنشینانەش بە هەموو جۆرەکانیەوە لە یەکێتیە فیدرڵیەکانە
ئاڵایەکیان بۆخۆیان دەستنیشان کردووە  یان دەستنیشان دەکەن وەك سیمبولێك لەگەڵ کەیانەکانی تردا لێکیان جیابکاتەوە.
با ئەوەشی بخرێتە سەر کە هەندێ دەوڵەتی ساکاری لێك نەبەستراو (غیر مرکبە) مافی داوە بە هەندێ لەو یەکە ئیداریانەی کە لێیانەوە پێك هاتووە ئاڵای تایبەتی خۆیان هەبێت پەرلەمانی کوردستانی عێراق بە بڕیاری مێژوویی ژمارە ٢٢ی خۆی لە ڕۆژی ٤/١٠/١٩٩٢ دا و بە تێکڕای دەنگ چارەنوسی گەلی کوردی لە کوردستانی عێراق دیاری کرد. پەیوەندیە دەستوریەکانی بۆ ئەم قۆناغە لەگەڵ دەسەلاتی مەرکەزیدا لەسەر بنەمای یەکێتی فیدڕاڵی لەناو عێراقێکی دیموکراسی پەرلەمانیدا دیاری کرد کە باوەڕی بە سیستەمی فرەحزبی هەبێت و ڕێز لە مافەکانی مرۆڤ بگرێ و لە بەڵگەنامە دەوڵەتیەکاندا دانی پیاندراوە
ئەم بڕیارە تێکڕای دەنگی خەڵکی کوردستانی بە هەموو پێکهاتە و توێژ و ڕێکخراوەکانیەوە بە دەست هێنا، هەروەها زۆربەی هەرە زۆری هێزە ڕکابەرەکانی عێراق پشتگیریان لێکرد، بۆیە هەرێمی کوردستانی عێراق مافی خۆی بوو ئاڵایەك بۆخۆی دیاری بکات کە گوزارشت لە قارەمانێتی و سەربەرزیەکانی و هەروەها لە دیرۆك و خەبات و بۆچوونەکانی گەلەکەی. کوردستان ئاڵای خۆی هەبووە کە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دوای خۆی دەستا و دەست هاتووە و سەرکردە دڵسۆزەکانی کورد پاراستویانە داکۆکیان لێکردووە.



# ئاڵای کوردستان و ڕەنگەکانی

ئاڵای کوردستان پێکاهاتووە لە سێ ڕەنگ و درووشمێك لە ناوەندی. ئاڵای کوردستان لە لاکێشەی ئاسۆیی پێکهاتووە، لاکێشەی سەرەوە ڕەنگی سوورە. ئەوەی ناوەند ڕنگی سپییە، و لاکێشەی خوارەوە ڕەنگی سەوزە. بەرینی ئاڵا دوو لەسەر سێ ی درێژییەکەیەتی. درووشمی نەتەوەیی ئاڵای کوردستان خۆری زێڕینە، ئەم خۆرە 21 پەڕ (تیشك) ی یەکسان و هاوشێوەی هەیە. بە لەبەرچاوگرتنی دوو لەسەر سێیەتی قەبارەی ئاڵا، خۆری زێڕین بە پەڕەکانییەوە یەك (1) پێوەرە و بەبێ پەڕەکان نیو (0.5) پێوەر، ئەم پەڕانە شێوەیان ڕاستە و لەدەرەوە خاڵێکی تیژ درووست دەکەن. خۆرەکە دەبێ ڕێك لە چەق (ناوەندی) ئاڵای کورستان جێگیر بێت. خۆر بەشێوەیەك جێگیر کراوە کە ستوونی ناوەندی ئاڵا بە ناو خاڵی تیژی بەرزترین پەڕ (تیشك) تێدەپەڕێت.

ڕەنگەکانی ئاڵای کوردستان بەم شێوەی خوارەوەیە:

سوور: PMS 032

سەوز: PMS 354

زەرد: PMS 116

شێوەکانی بەکار هێنانی ئاڵا هەڵواسینی بە دارا، پێویستە خۆرەکەی لە هەردوو ڕووەوە دیار بێت. بەرز کردنەوەی لە باری پانی، ڕەنگی سوور لە سەرەوە و ڕەنگی سەوز لە خوارەوە. بەرز کردنەوەی لە باری درێژی، ڕەنگی سوور لە لای چەپ و ڕەنگی سەوز لە لای ڕاست. لە یەخەدانی وەك ڕۆزێت لەسەر سینگ، لە لای چەپ لەسەر دڵ هەڵ ئەگیرێت. لە سەر مێز دانانی، پێویستە بە لای چەپدا بشکێتەوە.(22)








# لیستی سەرچاوەکان، ژمارەکان:


١- کۆماری کوردستان لاپەڕەیێکی زێڕینی مێژوویی نەتەوەی کورد، ڕەحمان نەقشی، لاپەڕە ٨٥.

٢- یاسای ژمارە (١٤)ی ساڵی ١٩٩٩، پەرلەمانی کوردستان
یاسای ئاڵای هەرێمی کوردستان، لاپەڕە ١٧٨.

٣- https://areq.net/m/%D8%B9%D9%84%D9%85_(%D8%B1%D8%A7%D9%8A%D8%A9).html

٤-
**National Flag -The official website of Denmark. An earlier use of the white cross on red is attested by an armorial (Netherlands) of 1370-1386. In later monastic tradition, the Danneborg made its first, miraculous appearance at the Battle of Lyndanisse on 15 June 1219**

٥- https://maaal.com/2023/03/%D8%A7%D9%84%D8%B9%D9%8E%D9%84%D9%8E%D9%85-%D8%B1%D9%85%D8%B2-%D9%88%D8%AD%D9%83%D8%A7%D9%8A%D8%A9-%D9%88%D8%AF%D9%84%D8%A7%D9%84%D8%A9-/

٦- https://wishe.net/dreja.aspx?=hewal&jmare=5744&Jor=2

٧- هەنبانە بۆرینە، هەژار موکریان.

٨- www.puk.media.ئاڵای کوردستان.

٩- شەرەفنامە، شەرەفخانی بەدلیسی، و: هەژار موکریانی، چاپی سێیەم، دەزگای ئاراس ب.٤١٠، لاپەڕە ٣٣٦-٣٣٧.

١٠-میرنشینی بابان، ئەردەڵان، سۆران، محمد حەمە باقی، چاپی یەکەم، بڵاوکراوەی دەزگای ئاراس ب. ١٥٥، لاپەڕە ١٤٤

١١-
https://zaniary.com/blog/61274fe324d00/%D9%85%DB%8C%D8%B1%D9%86%D8%B4%DB%8C%D9%86%DB%8C-%D8%B3%DB%86%D8%B1%D8%A7%D9%86#h4a



# لیستی سەرچاوەکان، ژمارەکان:


١٢-

Facts On File, Incorporated (2009). Encyclopedia of the Peoples of Africa and the Middle East, Kingdom of Kurdistan. ISBN 9781438126760. Retrieved 23 October 2014.

١٣-

شۆڕشەکانی کورد و کورد و کۆماری عێراق، عەلائەدین سەججادی، چاپی یەکەم، بڵاوکراوەی سنە کوردستان، لاپەڕە ٢٦.

١٤-

شۆڕشەکانی کورد و کورد و کۆماری عێراق، عەلائەدین سەججادی، چاپی یەکەم، بڵاوکراوەی سنە کوردستان، لاپەڕە ٢٣٧.

١٥-

کریس کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدە و بیست.

١٦-

کۆماری کوردستان لاپەڕەیێکی زێڕینی مێژوویی نەتەوەی کورد، ڕەحمان نەقشی، لاپەڕە ٧

١٧-

کۆماری کوردستان لاپەڕەیێکی زێڕینی مێژوویی نەتەوەی کورد، ڕەحمان نەقشی، لاپەڕە ٨

١٨-

چێشتی مجێوەر-هەژاری موکریانی.

١٩-

کۆماری کوردستان لاپەڕەیێکی زێڕینی مێژوویی نەتەوەی کورد، ڕەحمان نەقشی، لاپەڕە ٩

٢٠-

https://www.peyamakurd.com/sorani/Kurdistan/o-n-m-ordst-n-l-m-h-b-d-door-do-rd

٢١-

یاسای ژمارە (١٤)ی ساڵی ١٩٩٩

یاسای ئاڵای هەرێمی کوردستان. لاپەڕە ١٧٨-١٧٩

٢٢-

https://www.kurdipedia.org/default.aspx?q=20090303095457152&lng=1#SourceTag_1526_1



# لیستی سەرچاوەکان:


کتێب:

١-کۆماری کوردستان لاپەڕەیێکی زێڕینی مێژوویی نەتەوەی کورد، ڕەحمان نەقشی.

٢ـ چێشتی مجێوەر، هەژاری موکریانی.

٣ـ هەنبانە بۆرینە، هەژاری موکریانی.

٤ـ کریس کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدە و بیست.

٥ـ شۆڕشەکانی کورد و کورد و کۆماری عێراق، عەلائەدین سەججادی، چاپی یەکەم، بلاّوکراوەی چاپەمەنی سنە کوردستان.

٦ـ شەرەفنامە، شەرەفخانی بەدلیسی، و: هەژار موکریانی، چاپی سێیەم، دەزگای چاپەمەنی ئاراس،هەولێر، بلاّوکراوەی ژ ٤١٠.

٧ـ میرنشینی بابان، ئەردەلان، سۆران، محمد حەمە باقی، چاپی یەکەم، بلاّوکراوەی دەزگای چاپەمەنی ئاراس، هەولێر،بلاّوکراوەی ژ ١٥٥.

توێژینەوەو ڕاپۆرت:

١ـ یاساکانی پەرلەمان ساڵی ١٩٩٩.

٢ـ

Facts On File, Incorporated (2009). Encyclopedia of the Peoples of Africa and the Middle East, Kingdom of Kurdistan. ISBN 9781438126760. Retrieved 23 October 2014.

ماڵپەڕی تۆڕی ئینتەرنێت گۆگڵ:

1- www.pukmedia.com

2- areq.net

3- wishe.net

4- National Flag -The official website of Denmark.

5- maaal.com

6- zaniary.com

7- www.peyamakurd.com

8-www.kurdipedia.org